# حەقیقەتی (لا إله إلا اللّه)

پێگەی، فەزڵی، شیکردنەوەی زمانەوانیانەی، پایەکانی، مەرجەکانی، واتا و داخوازییەکانی، چ کاتێك سوودی دەبێت بۆ بێژەرەکەی و چ کاتێك نایبێت


دانانی

زانای بەڕێز

صالح بن فوزان بن عبد اللّه الفوزان[١]

ئەندامی دەستەی گەورەزانایان لە عەرەبستانی سعودیە

(خودا بیپارێزێت)

وەرگێڕانی

خدرنەژاد کوردستانی

(خودا لێی خۆش بێت)




# پێشەکیی وەرگێڕ

**سوپاس و ستایش بۆ خودای پەروەردگاری جیهانەکان، سەڵاوات بڕژێ بەسەر پێغەمبەر و یاوەران و شوێنکەوتووان و یارانیان تا ڕۆژی دوایی.**

ئەم نامیلکەیە کە باسی حەقیقەتی وتەی (لا إله إلا الله) یە و بەپێزترین و مەزنترین بابەتە؛ ووتارێکی زانای بەڕێز شێخ: (ساڵەح بن فەوزان بن عەبدوڵلا ئەلفەوزان) ە (خودا بیپارێزێت)، کە لە ژمارە: ١٣ ی گۆڤاری (**البحوث الإسلامية**) دا بڵاوکراوەتەوە، بەندەش وەرمگرتووە و وەرمگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی، دڵنیاشم کە سوودی دەبێت بۆ خوێنەری بەڕێز، مەگەر پاچڤەکەی بەندە کەموکوڕیی تێدابێت، بەڵام بەندەش هەر ئەوەندەم لێدەوەشێتەوە، کە ئەویش تەنها لە فەزڵ و کۆمەکی خوداوەیە.

جگە لە پاچڤە کردنەکە؛ فەرموودەکانیم دەرهێناوە و بڕیاری تاقەسواری مەیدانی فەرموودەناسیی سەردەم (شێخ ئەلبانی) (ڕەحمەتی خودای لبێت) لەسەریانم خستووەتەڕوو، بۆدڵنیایی لە پلەی فەرموودەکان، دیارە ئەمە جگە لە فەرموودەکانی سەحیحی بوخاری و موسلیم کە بڕیاری هەموو موسوڵمانانی لەسەرە، هەردوو پیتی (ف ژ) بریتین لەکورتکراوەی )فەرموودەی ژمارە)، بۆ نموونە :ف ژ: (١٣٥)، واتە فەرموودەی ژمارە (١٣٥) لە سەرچاوەی ناوبراودا.

لە خودا داواکارم کە بمانگێڕێت لەو بەندانەی کە حەقیقەتی وتەی (لا إله إلا الله) تێیاندا ڕەنگ دەداتەوە و لەسەریشی دەمرن.

وصلى الله وسلم على نبينا محمد وآله وصحبه أجمعين . والحمد لله رب العالمين

**وەرگێڕ**

**خدرنەژاد کوردستانی**

(خودا لێی خۆش بێت)



## پێشەکی

الحمد لله، نحمده ونستعينه ونستغفره، ونتوب إليه، ونعوذ بالله من شرور أنفسنا وسيئات أعمالنا، من يهده الله فلا مضل له، ومن يضلل فلا هادي له، وأشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له، وأشهد أن محمدا عبده ورسوله، صلى الله عليه وعلى آله وأصحابه، وكل من اتبعه وتمسك بسنته إلى يوم الدين . . أما بعد:

خودای گەورە فەرمانی پێداوین بە زیکر و یادی خۆی و ستایشی زیکرکارانیشی کردووە و بەڵێنی پاداشتی مەزنیشی پێداون، فەرمانی داوە بە زیکری بە شێوەیەکی گشتی و پاش لێبوونەوە لە پەرستشەکانیش بە تایبەتی.

خودای گەورە فەرموویەتی: {فَإِذَا قَضَيْتُمُ الصَّلَاةَ فَاذْكُرُوا اللَّهَ قِيَامًا وَقُعُودًا وَعَلَى جُنُوبِكُمْ}[سورة النساء: ١٠٣]، واتە: "هەر کە لە نوێژ بوونەوە یادی خودا بکەن، بە ڕاوەستان و بە دانیشتن و بە ڕاکشاویشەوە - واتە لە گشت بارودۆخێکتاندا-"، هەروەها فەرموویەتی: {فَإِذَا قَضَيْتُمْ مَنَاسِكَكُمْ فَاذْكُرُوا اللَّهَ كَذِكْرِكُمْ آبَاءَكُمْ أَوْ أَشَدَّ ذِكْرًا}[سورة البقرة: ٢٠٠]، واتە: "هەرکە لە پەرستشەکانتان لێبوونەوە؛ یادی خودا بکەن وەک چۆن - لە سەردەمی نەفامیدا - یادی باب و باپیرانتان دەکرد و - بەڵکوو - لەوەش زۆرتر"، لەوە تایبەتتریش لە کاتی بەجێگەیاندنی ڕێوشوێنی حەجدا، وەک فەرموویەتی: {فَإِذَا أَفَضْتُمْ مِنْ عَرَفَاتٍ فَاذْكُرُوا اللَّهَ عِنْدَ الْمَشْعَرِ الْحَرَامِ}[سورة البقرة: ١٩٨]، واتە: "هەر کە لە عەرەفات هاتنەخوارێ؛ لە لای (المشعر الحرام) یادی خودا بکەن"، هەروەها دەفەرموێت: {وَيَذْكُرُوا اسْمَ اللَّهِ فِي أَيَّامٍ مَعْلُومَاتٍ عَلَى مَا رَزَقَهُمْ مِنْ بَهِيمَةِ الْأَنْعَامِ}[سورة الحج: ٢٨]، واتە: "وە یادی خودا بکەن لە چەند ڕۆژێکی دیاریکراودا لەسەر ئەو ئاژەڵانەی کە خودا پێی بەخشیون"، هەروەها فەرموویەتی: {وَاذْكُرُوا اللَّهَ فِي أَيَّامٍ مَعْدُودَاتٍ}[سورة البقرة: ٢٠٣]، واتە: "وە زیکری خودا بکەن لە چەند ڕۆژێکی کەمدا- مەبەست سێ ڕۆژەکەی پاش جەژنی قوربانە کە پێیان دەوترێت (ڕۆژەکانی تەشریق) -".



وه پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: «أيام التشريق أيام أكل وشرب وذكر لله»(١) ، واتە: "ڕۆژەکانی تەشریق ڕۆژی خواردن و نۆشین و یادی خودان".

وه خودای گەورە فەرموویەتی: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اذْكُرُوا اللَّهَ ذِكْرًا كَثِيرًا * وَسَبِّحُوهُ بُكْرَةً وَأَصِيلًا}[سورة الأحزاب: ٤١ - ٤٠]، واتە: "ئەی ئەوانەی کە ئیمانتان هێناوه یادی خودا زۆر بکەن * و بەیانی و ئێواره بە پاکی ڕابگرن ـ بەوەی کە بڵێن: سبحان الله وبحمده ـ". جا لەبەر ئەوەی کە باشترین زیکر بریتییە لە: لا إله الا الله وحده لا شريك له = هیچ خودایەکی ڕاستەقینە نییە جگە لە ئەڵڵا بە تاک و تەنها و هیچ هاوەڵێکی نییە، وەک پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: «خير الدعاء دعاء عرفة، وخير ما قلت أنا والنبيون من قبلي: لا إله إلا الله وحده لا شريك له، له الملك وله الحمد، وهو على كل شيء قدير»(٢)، واتە: "باشترین لاڵە لاڵەی ڕۆژی عەرەفەیە و، باشترین وتەش کە من و پێغەمبەرانی پێش منیش گوتوومانە؛ بریتییە لە: لا إله إلا الله وحده لا شريك له، له الملك وله الحمد، وهو على كل شيء قدير = هیچ خودایەکی ڕاستەقینە نییە؛ جگە لە ئەڵڵا بە تەنها و هیچ هاوەڵێکی نییە، موڵک هەر هی ئەوە و سوپاسیش هەر بۆ ئەو، وە بەسەر هەموو شتێکیشدا توانایە "؛ لەبەر ئەوەی کە ئەم وتە شکۆدارە (لا إله إلاّ الله) ئەم پلە بڵندەی لە نێوان زیکرەکانی دیکەدا هەیە و، ئەحکامگەلێکی پێوە بەندە و، مەرجگەلێکی هەیە و، خاوەنی واتا و داخوازییە و، هەر تەنها وتەیەکی ڕووت نییە کە بە زمان بگوترێت و ببڕێتەوە، لەبەر ئەمانە هەمووی، پێم باش بوو کە بابەتی ئەم وتارە کورتەم سەبارەت بەو وتە مەزنە بێت، لە خودای گەورە داواکارم؛ لەگەڵ ئێوەدا بمانگێڕێت بە هۆگرانی ئەم وتەیە، ئەوانەی دەستبەندن پێوەی و بە واتاکەی شارەزان، ئەوانەی کە جێبەجێکاری داخوازییەکانین بە ئاشکرا و بە پەنهان.

---

(١) لە گێڕانەوەی موسلیم، فەرموودەی ژمارە: (١١٤١).

(٢) لە گێڕانەوەی: تیرمیزی، شێخ ئەلبانیش بە حەسەنی داناوە، بڕوانە: (صحيح سنن الترمذي) فەرموودەی ژمارە: (٣٥٨٥).

باسەکەم دەربارەی ئەم وتەیە لە چوارچێوەی ئەم خاڵانەی خوارەوەدا دەبێت:

پێگەی (لا إله إلاّ الله) لە ژیاندا، فەزڵی، شیکردنەوەی زمانەوانییانەی، پایەکانی، مەرجەکانی، واتای، داخوازییەکانی و ئایا چ کاتێک وتنی سوودی دەبێت بۆ مرۆڤ و چ کاتێکیش سوودی نابێت . . جا پشت بەخودای گەورە دەڵێم:

## پێگەی وتەی (لا إله الا الله):

ئەم وتەیە موسوڵمانان لە بانگ و قامەت و وتار و گفتوگۆکانیاندا ڕایدەگەیەنن، ئەم وتەیە؛ زەوی و ئاسمانی پێ بەندە، هۆکاری بوونی ئافراوە دی ژمارەیان هەرچەندە، هەر بۆ ئەمەش خودای گەورە؛ پێغەمبەرانی ناردووە و، پەرتووکی دابەزاندووە و، شەریعەتی ڕازاندووە، تەرازووش؛ هەر بەم مەبەستە هەڵنراون، کارنامەش وا دانراون، بازاڕی بەهەشت و دۆزەخ؛ هەر لەبەر ئەو ڕێکخراون، ئافراوانیش هەر بەم چەشنە بوون بە دوو پێڕ: ئیمانداری گەنجینە زێڕ؛ بێباوەڕی بێهۆشی گێڕ، ئەم وتەیە؛ بناوانی ئافراندن و گشت کارێکە و پێوەری پاداشت و سزای گشت سەردار و هەژارێکە، ئەو حەققەیە؛ ئافراوانی لە پێناودا ئافرێنراوە، پرسیار و لێپرسینەوەش لەسەر ئەم و مافەکانی دانراوە، پاداشت و سزای بەندەکان؛ بەم پێڕەوە ڕێکخراوە، قیبلە بۆ ئەم هەڵنراوە و، دین لەسەر ئەم دامەزراوە، شمشێری جیهادیش تەنها بۆ مافی ئەم ڕاکێشراوە، مافی خودا لەسەر بەندەکان سەرجەمە، وتەی چوونە ناو ئیسلامە بە دڵمەندی نەک بە گەمە، کلیلی ماڵی ئاشتییە، کە بەهەشتی پاک لە خەمە، ئەوەڵ و ئاخری خەڵکی؛ بەرپرسن لە ماک و چەمکی، هیچ بەندەیەک تێناپەڕێ تا دوو پرسیاری لێ دەکرێ: چیتان دەپەرست، وەڵامی پێغەمبەرانتان بە چی دایەوە؟ جا وەڵامی یەکەمیان؛ بریتییە لە بەجێگەیاندنی داخوازییەکانی (لا إله إلاّ الله) لە: شارەزایی و بڕوای دڵ و کردەوە، دووەمیشیان: بەدیهێنانی داخوازییەکانی (محمد رسول الله) لە: شارەزایی و پێڕەوی لێی و ملکەچی بۆی[(٣)].

---

(٣) بڕوانە: (زاد المعاد لابن القيم: [ ١ \ ٢ ]).

ئەم وتەیە، جوێکەرەوەی نێوان کوفر و ئیسلامە و، وتەی تەقوا و قوڵپی هەرەقایمە، ئەو وتەیە کە پێغەمبەر ئیبراهیم کردی بە: {كَلِمَةً بَاقِيَةً فِي عَقِبِهِ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ}[سورة الزخرف: ٢٨]، واتە: "وتەیەکی مانگار لە نێو نەوەکەیدا، بە ئومێدی ئەوەی بگەڕێنەوە سەری"، ئەمە ئەو وتەیە؛ کە خودا بۆ خۆی شاهێدی پێداوە و لە ئافراوەکانیشی فریشتەکان و زانایانیش ئەم شاهێدییەیان پێداوە، خودای گەورە فەرموویەتی: {شَهِدَ اللَّهُ أَنَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ وَالْمَلَائِكَةُ وَأُولُو الْعِلْمِ قَائِمًا بِالْقِسْطِ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ }[سورة آل عمران: ١٨]، واتە: "خودا شاهێدی دەدات، هەروەها فریشتەکان و زانایانیش؛ کە هیچ خودایەک جگە لە ئەو نییە و خودایەکی دادپەروەرە، هیچ خودایەک جگە لەو نییە و خودایەکی گەورە و کاربەجێیە"[٤]، ئەم وتەیە؛ وتەی پاکنیازی (ئیخلاس) و شاهێدیی ڕاستی و بانگەوازی حەق و پاکانەیە لە شیرک، هەر لەبەر ئەمیش ئافراوەکان ئافرێنراون، هەروەک خودای گەورە فەرموویەتی: {وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنْسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ}[سورة الذاريات: ٥٦]، واتە: "جنۆکە و مرۆڤم تەنها بۆ پەرستنم نەبێت بۆ هیچی دیکەم نەئافراندوون"، پێغەمبەرانیش هەر بەم بۆنەیەوە نێردراون و، پەرتووکەکانیش هەر لەبەر ئەمە دابەزێنراون، هەروەک دەفەرموێت: {وَمَا أَرْسَلْنَا مِنْ قَبْلِكَ مِنْ رَسُولٍ إِلَّا نُوحِي إِلَيْهِ أَنَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنَا فَاعْبُدُونِ}[سورة الأنبياء: ٢٥]، واتە: "پێش تۆیش هەر پێغەمبەرێکمان ناردبێت؛ وەحیمان بۆ کردووە کە: هیچ خودایەک جگە لە من نییە، جا هەر من بپەرستن"، هەروەها فەرموویەتی: {يُنَزِّلُ الْمَلَائِكَةَ بِالرُّوحِ مِنْ أَمْرِهِ عَلَى مَنْ يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ أَنْ أَنْذِرُوا أَنَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنَا فَاتَّقُونِ}[سورة النحل: ٢]، واتە: "فریشتان دەنێرێتە خوارێ بە وەحی، لە فەرمانی خۆی بۆ سەر هەر کەسێک خۆی بیەوێت لە بەندەکانی؛ کە خەڵک بترسێنن، بەوەی کە هیچ خودایەک نییە بێجگە لە من، جا لێم بترسن ".

ئیبن عویەینە دەفەرموێت: "خودا هیچ نیعمەتێکی نەداوە بە بەندەکانی کە لە پێناساندنی (لا إله إلا الله) گەورەتر بێت، وە (لا إله إلا الله) بۆ خەڵکی بەهەشت

---

[٤] بڕوانە: (مجموعة التوحيد: [١٠٥ , ١٦٧]).



وەک ئاوی سارد وایە بۆ خەڵکی دونیا"[٥]، ئەوەی بیڵێت ماڵ و خوێنی پارێزراو دەبێت، هەرکەسێکیش نکووڵیی بکات ئەوە ماڵ و خوێنی فیڕۆیە، لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: «من قال : لا إله إلا الله ، وكفر بما يعبد من دون الله حرم ماله ودمه وحسابه على الله»[٦]، **واتە:** "هەرکێ بڵێت (**لا إله إلا الله**) و بێباوەڕ ببێت بە هەرچییەک کە جگە لە خودا دەپەرسترێت؛ ئەوە ماڵ و خوێنی حەرام دەبێت و ئیتر حسابی دیکەی لای خودایە".

هەروەها ئەم وتەیە یەکەم شتە کە لە کافران داوا دەکرێت کاتێک کە بانگ دەکرێن بۆ ئیسلام، پێغەمبەر (ﷺ) کاتێک کە موعازی نارد بۆ یەمەن؛ پێی فەرموو: "تۆ دەچیتە لای خەڵکێک کە ئەهلی کیتابن، با یەکەم شتێک کە بانگیان دەکەیت بۆی؛ شایەتمانی (**لا إله إلا الله**) بێت"[٧].

بەم شێوەیە بۆت دەرکەوت کە (**لا إله إلا الله**) چ پێگەیەکی لە دیندا هەیە و لە ژیاندا چەندە گرنگە، هەروەها زانیت کە ئەمە یەکەمین واجبی سەرشانی بەندەکانە، چونکە ئەمە ئەو بناغەیە بەرجەستە دەکات کە هەموو کارەکانی دیکەی لەسەر بەندە.

## فەزڵی وتەی (لا إله الا الله):

ئەم وتەیە فەزڵێکی مەزن و جێگەیەکی تایبەتی لای خودا هەن، هەرکەسێک بە ڕاستگۆیی بیڵێت؛ خودا دەیخاتە بەهەشت، هەرکێش بە درۆزنی بیڵێت؛ ئەوە خوێن و ماڵی پارێزراو دەبێت و حسابی دیکەی دەکەوێتە لای خودای گەورە، ئەم وتەیە لەگەڵ ئەوەی کە پیتەکانی کەمن و لەسەر زمانیش ئاسانە؛ بەڵام لە ترازوودا گەلێک سەنگینە، لە ئەبو سەعیدی خودرییەوە (ﷺ) کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: «قال موسى عليـــه الســـلام: يا رب علمني شيئا أذكرك به

---

[٥] **بروانە:** (مجموعة التوحيد: [١٠٥ , ١٦٧]).

[٦] **بروانە:** (كلمة الإخلاص لابن رجب: [٥٢-٥٣]).

[٧] **لە گێڕانەوەی:** بوخاری: (٤٠٩٠) و موسلیم: (١٩).



وأدعوك به؟ قال: يا موسى قل: لا إله إلا الله، قال: يا رب كل عبادك يقول هذا، قال: قل: لا إله إلا الله، قال: لا إله إلا أنت، يا رب إنما أريد شيئا تخصني به، قال: يا موسى لو كان السماوات السبع وعامرهن غيري والأرضين السبع في كفة ولا إله إلا الله في كفة مالت بهن لا إله إلا الله»[(٨)] ، **واته: "مووسا (عليه السلام) گوتی: خودایە شتێکم فێر بکە کە یادی تۆی پێ بکەم و پێی پاڕێمەوە لێت؟ خودا فەرمووی: ئەی موسا! بڵێ: (لا إله إلا الله)، موسا گوتی: خودایە! خۆ هەموو بەندەکانت ئەمە دەڵێن، خودا فەرمووی: تۆ بڵێ (لا إله إلا الله)، گوتی: خۆ هیچ خودایەکی ڕاستەقین نییە جگە لە تۆ، بەڵام خودایە من دەمەوێت شتێک تایبەت بکەیت بە منەوە، خودای گەورە فەرمووی: ئەی موسا ئەگەر هەر حەوت ئاسمان و ئاوەدانکەرەوەکانیشیان بێجگە لە خۆم لەگەڵ حەوت چینەی زەوی بخەیتە تایەک و (لا إله إلا الله) ش بخەیتە تایەکەی دیکە؛ ئەوە (لا إله إلا الله) لەوانی دیکە سەنگینترە"، ئەم فەرموودەیە، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە (لا إله إلا الله) باشترین زیکرە، وە لە فەرموودەکەی عەبدوڵڵای کوڕی عەمردا (رضي الله عنهما) هاتووە کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی:** «خير الدعاء دعاء يوم عرفة، وخير ما قلت أنا والنبيون من قبلي: لا إله إلا الله وحده لا شريك له له الملك وله الحمد وهو على كل شيء قدير»[(٩)]، **واته: "باشترین لاڵە؛ لاڵەی ڕۆژی عەرەفەیە و، باشترین وتەش کە من و پێغەمبەرانی پێش منیش گوتوومانە؛ بریتییە لە:** (لا إله إلا الله وحـــده لا شريك له، له الملك

---

(٨) **لە گێڕانەوەی حاکم و ئیبن حیببان، بەڵام ئەم فەرموودەیە لاوازە، بەپێی گوتەی شێخ ئەلبانی، بڕوانە:** (ضعيف الترغيب والترهيب) **ف ژ:** (٩٢٣)، **هەروەها:** (التعليقات الحسان على صحيح ابن حبان) **ف ژ:** (٦١٨٥). **بەڵام هەر لەم بارەیەوە فەرموودەیەکی سەحیح هاتووە، کە باسی ڕاسپاردەی کاتی سەرەمەرگی پێغەمبەر نووح (عليه السلام) دەکات بۆ کوڕەکەی، تێدا دەفەرموێت: "فەرمانت پێدەکەم بە (لا إله إلا الله)، چونکە ئەگەر هەر حەوت ئاسمان و هەر حەوت زەویەکە بخرێنە تایەکی ترازووەوە و (لا إله إلا الله) ش بخرێتە تایەکەوە؛ ئەوە (لا إله إلا الله) لەوان قورستر دەردەچوو ..."، لە گێڕانەوەی بوخاری لە (الأدب المفرد) دا و ئەحمەد و بەیهەقیش لە (الأسماء) دا، بڕوانە:** (سلسلة الأحاديث الصحيحة): **ف ژ:** (١٣٤).

(٩) **لە گێڕانەوەی تیرمزی، شێخ ئەلبانی بە حەسەنی داناوە، بڕوانە:** (صحيح سنن الترمذي): **ف ژ:** (٣٥٨٥).

وله الحمد ، وهو على كل شيء قدير) = **هیچ خودایەکی ڕاستەقینە نییە؛ جگە لە ئەڵڵا بە تەنها و هیچ هاوەڵێکی نییە، موڵک هەر هی ئەوە و سوپاسیش هەر بۆ ئەو، وە بەسەر هەموو شتێکیشدا توانایە**".

**هەر لەو فەرموودانەش کە سەنگینیی ئەم وتەیە دەسەلمێنێن لە ترازوودا؛ ئەوەی کە هەر عەبدوڵڵای کوڕی عەمر** (رضي الله عنهما) **دەیگێڕێتەوە کە پێغەمبەر** (ﷺ) **فەرموویەتی:** «يصاح برجل من أمتي على رءوس الخلائق يوم القيامة، فينشر له تسعة وتسعون سجلا كل سجل منها مد البصر، ثم يقال: أتنكر من هذا شيئا؟ فيقول: لا يا رب، فيقال: ألك عذر أو حسنة؟ فيهاب الرجل فيقول: لا . فيقال: بلى إن لك عندنا حسنة، وإنه لا ظلم عليك. فيخرج له بطاقة فيها أشهد أن لا إله إلا الله، وأشهد أن محمدا عبده ورسوله ، فيقول : يا رب ، ما هذه البطاقة مع هذه السجلات؟ فيقال: إنك لا تظلم. فتوضع السجلات في كفة والبطاقة في كفة فطاشت السجلات وثقلت البطاقة»[(١٠)]، **واتە: " ڕۆژی قیامەت پیاوێکی ئۆمەتەکەم بە بەرچاوی هەموو ئافراوەکانەوە بانگ دەکرێت؛ نەوەد و نۆ قەواڵەی بۆ دەکەنەوە کە هەر قەواڵەیەکی بە قەد ماوەی بینینی چاو دەبێت، پاشان پێی دەوترێت: هیچ لاریت هەیە لەمە؟ دەڵێت: نەخێر خودایە، پێی دەوترێت: هیچ بیانوویەک یان چاکەیەک شک دەبەیت؟ پیاوەکە دەترسێت و دەڵێت: نەخێر، پێی دەگوترێت: بەڵێ چاکەیەکت لای ئێمە هەیە و هیچ ستەمێکت لێناکرێت لێرە، جا کارتێکی بۆ دەردەهێنن؛ شایەتمانی** (أشهد أن لا إله إلا الله ، وأشهد أن محمدا عبده ورسوله)**ی تێدایە، پیاوەکە دەڵێت: خودایە! ئەم کارتە چ بایەخێکی هەیە لە بەرامبەر ئەو هەمووە قەواڵەیەدا؟ پێی دەگوترێت: تۆ ستەمت لێناکرێت، ئەوجا قەواڵەکان دەخرێنە تایەکی ترازوو و کارتەکەش دەخرێتە تایەکەی دیکە، کەچی قەواڵەکان لە بێسەنگیدا دەفڕن و کارتەکەش لە قورسیدا دادەبەزێت**".

**ئەم وتە مەزنە؛ فەزڵی زۆر و زەبەندی هەن، حافیز ئیبن ڕەجەب لە نامیلکەی** (كلمة الإخلاص) **دا کۆمەڵێکیانی لێ باس کردووە و بۆ هەر**

---

(١٠) لە گێڕانەوەی ترمیزی و ئیبن ماجە و ئەحمەد، شێخ ئەلبانی بە سەحیحی داناوە، بڕوانە: (سلسلة الأحاديث الصحيحة) ی شێخ ئەلبانی: ف ژ: (١٣٥).

فەزڵێکیش بەڵگەی هێناوەتەوە، لەوانە: ئەم وتەیە نرخی بەهەشتە، هەرکەسێک دوایین وتەی بێت دەچێتە بەهەشت، دەرباز بوونە لە ئاگر، لێخۆشبوون مسۆگەر دەکات، باشترین چاکەیە، تاوانەکان دەسڕێتەوە، هەموو لەمپەرێک تێپەڕ دەکات تا دەگاتە لای خودای گەورە، ئەو وتارەیە کە خودا بڕوا بە بێژەرەکەی دەکات، باشترین وتەی پێغەمبەرانە، باشترین زیکرە، باشترینی کردەوەکانە و زۆرترین پاداشتی هەیە، بەقەد ئازاد کردنی کۆیلەیەک دەبێت، پەناگەیە لە شەیتان، ئارامبەخشی ترسی گۆڕ و سامی حەشرە و، درووشمی ئیماندارانە کاتێک کە لە گۆڕ ڕاست دەبنەوە، هەروەها: هەر هەشت دەرگاکەی بەهەشت دەکرێنەوە بۆ هەرکەسێک کە گوتبێتی، جا لە هەر دەرگایەکەوە بیەوێت دەچێتە ژوورێ، هەروەها ئەهلی ئەم وتەیە گەرچی بە هۆی کەمتەرخەمییان لەمەڕ مافەکانی بچنە دۆزەخ؛ بەڵام ئاخری هەر دەبێ بێنە دەرێ، ئەمە سەردێڕی باسی ئەو فەزڵانەن؛ کە ئیبن ڕەجەب لەو نامیلکەیەیدا هێناونی و بەڵگەی بۆ هەریەکێکیشیان هێناوەتەوە.

## شیکردنەوەی زمانەوانییانەی (**لا إله الا الله**):

دیارە کەتێگەیشتن لە واتای ڕستەیەک بەندە بە شیکردنەوەی لە ڕووی زمانەوانییەوە؛ هەربۆیە زانایان (ڕەحمەتی خودایان لێبێت) گرنگییان داوە بە شیکردنەوەی وتەی (لا إله إلا الله).

گوتوویانە: (لا) نەرێکاری جنسە، (إله) ناوە نەرێکراوەکەیە و ڕۆنراوە لەسەر (سەر= فتح)، گوزارەکەی لابراوە و بریتییە لە (حق)، واتە: (لا إله حق = هیچ خودایەکی ڕاستەقینە نییە)، (إلا الله) هەڵاواردنە لە گوزارە (بۆردار = مرفوع) ەکە، (إله) یش واتە: پەرستراو، ئەو خودایەی دڵەکان دەیپەرستن و نیازی دەکەن، بە تەمای وەدەستهێنانی قازانجێک یان لادانی زیانێک.

## پایەکانی (**لا إله الا الله**):

وتەی (لا إله إلا الله) دوو پایەی هەیە:

پایەی یەکەم: نەرێ کردن.

پایەی دووەم: ئەرێ کردن.



نەرێ کردن واتە: نکووڵی کردنی خوایەتیی تێکڕای ئافراوەکان، جگە لە خودای ئافرێنەریان.

ئەرێ کردنیش واتە: چەسپاندنی خودایەتی بۆ (ئەڵڵا) (سبحانه وتعالى)، کە تەنها ئەو خودای ڕاستەقینەیە، وە هەرچی جگە لە (ئەڵڵا) کە هاوەڵپەرستەکان کردوویانە بە خودای خۆیان؛ هەر هەموویان درۆینە و پووچەڵن، خودای گەورە فەرموویەتی: {ذَلِكَ بِأَنَّ اللَّهَ هُوَ الْحَقُّ وَأَنَّ مَا يَدْعُونَ مِنْ دُونِهِ هُوَ الْبَاطِلُ}[سورة الحج: ٦٢]، واتە: "ئەوە لەبەر ئەوەی کە هەر (ئەڵڵا) ڕاستە و هەرشتێکی جگە لەو کە هاواری دەکەنێ پووچەڵە".

ئیمامی ئیبنولقەییم دەفەرموێت: "دەلالەتی وتەی (لا إله إلا الله) لەسەر سەلماندنی خودایەتیی (ئەڵڵا)؛ گەورەترە لەوەی کە بڵێیت: (اللهُ إلهٌ = ئەڵڵا خودایە)، چونکە وتەی (اللهُ إلهٌ = ئەڵڵا خودایە)؛ خودا بوونی جگە لە ئەڵڵا نەرێ ناکات، بە پێچەوانەی وتەی (لا إله إلا الله) کە خودایەتی تایبەت دەکات بە (ئەڵڵا) و نەرێی خودایەتیی جگە لە (ئەڵڵا) دەکات، هەرکەسێکیش وشەی (إله) بە واتای "توانای داهێنەر" لێکبداتەوە؛ ئەوە هەڵەیەکی زۆر گەورەی کردووە.

شێخ سولەیمان بن عەبدوڵڵا لە شەرحی (كتاب التوحيد) دا دەفەرموێت: "ئەگەر بگوترێت واتای خودا و خودایەتی ڕوون بووەتەوە؛ ئەی وەڵامی ئەو وتەیە چییە کە دەڵێت: (إله) واتە "توانای داهێنەر" یان دەستەواژەی لەم چەشنە؟ دەڵێین: وەڵامی ئەمە لە دوو ڕووەوە دەبێت، یەکێکیان: ئەم قسەیە داهێنراوە و هیچ زانایایەک و هیچ پێشەوایەکی زمانەوانی شتی وای نەگوتووە، وە وتەی زانایان و پێشەوایانی زمانەوانی بەو چەشنەیە کە ئێمە پێشتر باسمان کرد، ئیدی ئەم وتەیە پووچەڵە، دووەم: گریمان ئەم قسەیە ڕاستیش بێت؛ ئەوە دەبێتە لێکدانەوەیەک لەبارەی پێداویستیی (إله = خودا) ەوە، چونکە ئاشکرایە کە پێویستە (إله = خودا) ئافرێنەر بێت و توانستی داهێنانیشی هەبێت، ئەگەر وەها نەبێت ئەوە خودای ڕاستەقینە نییە؛ ئەگەرچی ناویش نرابێت خودا، جا مەبەست لەم قسەیە ئەوە نییە کە هەرکەسێک بزانێت خودا توانستی داهێنانی

هەیە؛ ئیتر ئەوە چووەتە ناو ئیسلام و مەبەستی (لا إله إلا الله) ی بەجێگەیاندووە، هیچ کەسێکیش ئەم قسەیە ناکات، چونکە ئەگەر وابێت؛ ئەوە دەشێت کافرەکانی عەرەب موسوڵمان بووبن، جا ئەگەر بێت و هەندێک لە خەڵکانی سەردەمانی دوایی مەبەستیان ئاوها بووبێت؛ ئەوە هەڵەیە و بە بەڵگەی شەرع و ئاوەزیش بەرپەرچە"(١١).

## مەرجەکانی (لا إله الا الله):

ئەم وتەیە سوود بە بێژەرەکەی ناگەیەنێت بە حەوت مەرج نەبێت:

یەکەم: (العلم) زانین، واتە: زانینی واتاکەی لە ڕووی "نەرێ و ئەرێ" وە.

دووەم: (اليقين) دڵنیایی، واتە: زانینێکی تەواو کە هەموو گومانێک بتارێنێت.

سێیەم: (الإخلاص) دڵسۆزی، واتە: تەنها لەبەر خودا بێت و شیرک بتارێنێت.

چوارەم: (الصدق) ڕاستگۆیی، واتە: بە ڕاستگۆیی بیڵێیت بە جۆرێک ڕێگە بە نیفاق نەدات.

پێنجەم: (المحبة) خۆشەویستی، واتە: خۆشەویستی بۆ هەر شتێک ئەم وتەیە بیگرێتەوە و دڵخۆش بوون پێی.

شەشەم: (الانقياد) ملکەچی، واتە: ملکەچ بوون بۆی بە جێبەجێ کردنی مافەکانی کە بریتییە لە کردەوە واجبەکان، ئەویش بە دڵسۆزی بۆ خودا بە تەنها و بە تەمای ڕەزامەندیی ئەو.

حەوتەم: (القبول) قبووڵ کردن، واتە: هەرچییەک ئەم وتەیە دەیگەیەنێت؛ قبووڵی بکەیت و لاریت لێی نەبێت. (فتح المجيد: [٩١])

ئەم مەرجانە؛ زانایان لەو دەقانەی قورئان و سوننەتەوە وەریانگرتووە کە تایبەت بەم وتە شکۆمەندە و ماف و مەرجەکانی هاتوون.

---

(١١) بروانە: (تيسير العزيز الحميد: [٨٠]).



## واتا و داخوازیی وتەی (لا إله الا الله):

وتەی (لا إله إلا الله) واتە: هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینە نییە جگە لە تەنها خودایەک کە (ئەڵڵا) یە و تاک و تەنهایە و هیچ هاوەڵێکی نییە، ئەم وتە مەزنە ئەوە لەخۆدەگرێت کە تێکڕای ئەوانەی جگە لە (ئەڵڵا) دەپەرسترێن؛ هیچیان خودای ڕاستەقینە نین و درۆینە و پووچەڵن.

هەر لەبەر ئەمەیە کە زۆر جار فەرمان بە پەرستنی خودا؛ هاوپێچە بە نەپەرستنی جگە لە خودا، چونکە پەرستنی خودا؛ لەگەڵ هاوەڵدانان بۆی درووست نییە، خودای گەورە فەرموویەتی: {وَاعْبُدُوا اللَّهَ وَلَا تُشْرِكُوا بِهِ شَيْئًا}[سورة النساء: ٣٦]، واتە: "خودا بپەرستن و هیچ شتێک مەکەن بە هاوەڵی"، هەروەها فەرموویەتی: {فَمَنْ يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ وَيُؤْمِنْ بِاللَّهِ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَى لَا انْفِصَامَ لَهَا وَاللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ}[سورة البقرة: ٢٥٦]، واتە:"جا هەرکەسێک بێبڕوا بێت بە تاغووت و ئیمان بهێنێت بە خودا؛ ئەوە دەستی گرتووە بە قوڵپە هەرەپتەوەکە کە پچڕانی بۆ نییە، وە خودا بیسەر و زانایە"، هەروەها فەرموویەتی: {وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَسُولًا أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ}[سورة النحل: ٣٦]، واتە: "وە بۆ گشت ئۆمەتێک پێغەمبەرێکمان ناردووە؛ کە خودا بپەرستن و دوور بن لە تاغووت"، وە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: «من قال لا إله إلا الله وكفر بما يعبد من دون الله حرم ماله ودمه»، واتە: "هەر کەسێک بڵێت: (لا إله إلا الله) و بێباوەڕیش بێت بە هەرچییەک کە جگە لە خودا دەپەرسترێت؛ ئەوە ماڵ و خوێنی حەرام دەبێت"، هەموو پێغەمبەرێکیش بە ئۆمەتەکەی دەگوت: {اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُمْ مِنْ إِلَهٍ غَيْرُهُ}[سورة الأعراف: ٥٩]، واتە: "خودا بپەرستن، هیچ خودایەکی دیکەتان جگە لە ئەو نییە"،.. و تا کۆتایی بەڵگەکانی دیکە، ئیمامی ئیبن ڕەجەب (ڕەحمەتی خودای لێبێت) دەفەرموێت: "بەجێگەیاندن و ڕوونکردنەوەی ئەم واتایە بەم جۆرەیە: بەندەی خودا کە دەڵێت: (لا إله إلا الله)؛ ئەوە دەگەیەنێت کە هیچ بە خودای خۆی نازانێت جگە لە (ئەڵڵا)، خوداش ئەوەیە کە گوێڕایەڵی دەبیت و نافەرمانیی ناکەیت، لەبەر هەیبەت و گەورەیی و، خوشویستن و ترس و ئومێد و پشت پێبەستن و

لێخواستن و لێپاڕانەوە، ئەمانەش هەمووی بۆ (ئەڵڵا) نەبێت ڕەوا نییە.

هەر لەبەر ئەمە بوو کاتێک کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بە کافرەکانی قورەیشی فەرموو: بڵێن: (لا إله إلا الله)؛ گوتیان: {أَجَعَلَ الْآلِهَةَ إِلَهًا وَاحِدًا إِنَّ هَذَا لَشَيْءٌ عُجَابٌ}[سورة ص الآية: ٥]، واتە: "چۆن ئەو هەموو خودایە - بتەکان - بە بەدرۆ دەزانێت و دەڵێت هەر یەک خودا ڕاستە؛ بەڕاستی ئەمە شتێکی زۆر سەیرە"، دەبینیت کە بە جۆرێک لەم وتەیە تێگەیشتن؛ کە پەرستنی بتەکان هەموو پووچەڵ دەکاتەوە و پەرستش تایبەت دەکات بە خوداوە بەتاک و تەنها، جا ئەوانیش ئەمەیان نەدەویست، بەم واتایە ڕوون بووەوە کە واتا و داخوازیی (لا إله إلا الله) بریتییە لە: پەرستنی خودا بە تاک و تەنها و وازهێنان لە پەرستنی غەیری خودا، بەندەی خودا کە دەڵێت: (لا إله إلا الله) ئەوە ڕایدەگەیەنێت کە پێویستە تەنها خودا بپەرستێت و پەرستنی غەیری خودا بە پوچەڵ دەزانێت، وەک پەرستنی بت و گۆڕ و خواناسان و پیاوچاکان، بەمەش ئەوە پووچەڵ دەبێتەوە کە گۆڕپەرستەکانی ئەمڕۆ و هاوشێوەکانیان وادەزانن واتای (لا إله إلا الله) بریتیە لە: بڕوا بوون بە بوونی خودا، یان کە خودا خوڵقێنەرە و توانستی داهێنانی هەیە و بەس و ئالەم جۆرە باوەڕانە، یان وا بزانێت (لا إله إلا الله) واتە: فەرمانڕەوایی تەنها بۆ خودایە، وە وادەزانن ئەوەی بڕوای ئاوەها بێت و وتەی (لا إله إلا الله) بەو شێوەیە لێکبداتەوە؛ ئیدی ئەوە یەکخواپەرستیی ڕەهای بەجێگەیاندووە، ئەگەر چی هەر کارێک بکات لە پەرستنی جگە لە خودا و باوەڕ بوون بە مردووان و خۆنزیک کردنەوە لێیان بە قوربانی و نەزر و سووڕ خواردن بە دەوری گۆڕەکانیاندا و پیرۆزی خواستن (تبرّك) بە خۆڵەکەیان، ئیدی نازانن کە کافرە سەرەتاییەکانی عەرەبیش لەم بیروباوەڕەدا هاوڕایان بوون و دەیانزانی کە هەر خودا ئافرێنەری بەتوانستی داهێنەرە و دانیان پێدا دەنا و، ئەو پەرستشەش کە بۆ غەیری خودا دەیانکرد تەنها لەبەر ئەوە بوو کە پێیان وابوو لە خوداوە نزیکیان دەخاتەوە، نەک لەبەر ئەوەی کە دەخوڵقێنن و ڕزق و ڕۆزی دەدەن.

خۆ ئەگەر واتای (لا إله إلا الله) بەو جۆرە بووایە کە ئەمانە دەیڵێن؛ ئەوە هیچ کێشەیەک لە نێوان پێغەمبەر (ﷺ) و موشریکەکاندا نەدەکەوتەوە، بەڵکوو دەستبەجێ دەچوون بە دەم بانگەوازەکەیەوە، ئەمە ئەگەر وەک ئەمانە دەڵێن؛ پێی بگووتبان: دان بنێن بەوەی کە تەنها خودا توانایە لە داهێناندا، بەڵام ئەوان ئەهلی زمانی عەرەبی بوون و دەیانزانی کە ئەگەر بڵێن: (لا إله إلا الله)؛ ئەوە پەرستنی بتەکانیان بە پووچەڵ زانیوە، وە تێگەیشتن کە ئەم وتەیە تەنها بێژەیەکی بێواتا نییە، هەر بۆیە لێی سڵەمینەوە و گوتیان: {أَجَعَلَ الْآلِهَةَ إِلَهًا وَاحِدًا إِنَّ هَذَا لَشَيْءٌ عُجَابٌ}[سورة ص: ٥]، واتە: "چۆن ئەو هەموو خودایە - بتەکان - بە بەدرۆ دەزانێت و دەڵێت هەر یەک خودا ڕاستە؛ بەڕاستی ئەمە شتێکی زۆر سەیرە"، هەروەک خودای گەورەش لە بارەیانەوە دەفەرموێت: {إِنَّهُمْ كَانُوا إِذَا قِيلَ لَهُمْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ يَسْتَكْبِرُونَ * وَيَقُولُونَ أَئِنَّا لَتَارِكُوا آلِهَتِنَا لِشَاعِرٍ مَجْنُونٍ}[سورة الصافات: ٣٥ - ٣٦]، واتە: "ئەو موشریکانە ئەگەر پێیان بگوترایە: (لا إله إلا الله) خۆیان بە زل دەزانی * و دەیانگوت: ئێمە وازبێنین لە پەرستنی خوداکانمان بۆ شاعیرێکی شێت؟"، بەمجۆرە دەیانزانی کە (لا إله إلا الله) ئەوە دەخوازێت کە واز لە پەرستنی جگە لە خودا بهێنن و تەنها ئەو بپەرستن، وە ئەگەر بیانگوتایە و بەردەوام بان لە پەرستنی بتەکان؛ ئەوە لەگەڵ خۆیان ناکۆک دەبوون، بەڵام گۆڕپەرستەکانی ئەمڕۆ گوێ نادەنە ئەم ناکۆکییە درزێوە، دێن دەڵێن: (لا إله إلا الله) و پاشان هەڵیدەوەشێننەوە بە پەرستنی مردووان و خۆنزیککردنەوە لە گۆڕەکانیان بە چەندین پەرستشی جۆراوجۆر، دەک داوەشێت ئەوەی کە ئەبوجەهل و ئەبولەهەب لەو باشتر واتای (لا إله إلا الله) یان دەزانی، **جا ئەنجام ئەمەیە**: هەرکەسێک ئەم وتەیە بڵێت و واتاکەی بزانێت و داخوازیەکانی بە ئاشکرا و نهێنی جێبەجێ بکات لە نەهێشتنی شیرک و چەسپاندنی پەرستش بۆ خودا لەگەڵ باوەڕێکی دامەزراو بە ناوەڕۆکی و کارپێکردنی؛ **ئەوە موسوڵمانی ڕاستەقینەیە**، هەر کەسێکیش بیڵێت و بە ڕواڵەت کار بە داخوازییەکانی بکات، بەڵام بەبێ باوەڕبوون بە واتاکەی؛ **ئەوە دووڕوو (منافق)ە**، هەر کەسێکیش بە زمان بیڵێت و بە پێچەوانەیەوە کار بکات، بـە

هاوەڵدانان کە دژێتی؛ **ئەوە کافرە، ئەگەرچی هەزاران جاریش بیڵێت**، چونکە بە کارەکەی؛ گوتنەکەی پووچەڵ دەکاتەوە، هەربۆیە دەبێت لەگەڵ گوتنی ئەم وتەیەدا واتاکەی بزانرێت، چونکە زانینی واتاکەی هۆکارە بۆ بەجێگەیاندنی داخوازییەکانی، خودای گەورە فەرموویەتی: {إِلَّا مَنْ شَهِدَ بِالْحَقِّ وَهُمْ يَعْلَمُونَ}[سورة الزخرف: ٨٦]، واتە: "مەگەر ئەوانەی کە بە ڕاستی شاهێدی دەدەن و حەقیقەتی ئەو شاهێدییەش دەزانن"، جا ئامانج لەم وتەیە؛ بریتییە لە: بەجێگەیاندنی داخوازیی ئەم وتەیە، کە لە وازهێنان لە پەرستنی جگە لە خودا و، پەرستنی خودا بە تاک و تەنهادا، بەرجەستە دەبێت.

## گوتنی (لا إله الا الله) چ کاتێک سوود بە مرۆڤ دەگەیەنێت؟

پێشتر گوتمان گوتنی (لا إله إلا الله) پێویستە هاوپێچ بێت بە زانینی واتاکەی و کارکردن بە داخوازییەکەی، بەڵام لەبەر ئەوەی هەندێک دەق هەن کە ڕەنگە گومانی ئەوەیان لێبکرێت؛ کە تەنها گوتنی ئەم وتەیە بەسە، وە خەڵکانێکیش بەم جۆرە گومانەوە گیرۆدە بوون؛ لەبەر ئەمە ڕوونکردنەوەی ئەم پرسە پێویست بوو، بۆ لابردنی ئەم گومانە لا کەسانێک کە ڕاستییان دەوێت، شێخ سولەیمان بن عەبدوڵڵا (ڕەحمەتی خودای لێبێت) لەبارەی ئەم فەرموودەیەی عیتبانەوە: «فإن الله حرم على النار من قال لا إله إلا الله يبتغي بذلك وجه الله»[١٢]، واتە: "هەرکەسێک بڵێت: (لا إله إلا الله) و مەبەستی پێی تەنها خودا بێت؛ ئەوە خودا حەرامی دەکات لە ئاگر"، شێخ سولەیمان لەم بارەیەوە دەفەرموێت: "بزانە کە فەرموودەگەلێک هەن بە ڕواڵەت ئەوە دەگەیەنن کە هەر کەسێک تەنها شایەتمان بهێنێت ئەوە ناچێتە ئاگرەوە، وەک ئەم فەرموودەیە و فەرموودەکەی ئەنەس کە دەڵێت: "پێغەمبەر (ﷺ) بەسواری وڵاخ و موعازیش لە پەنایەوە بوو؛ پێی فەرموو: ئەی موعاز! گوتی: بەڵێ فەرمانت جێبەجێیە ئەی پێغەمبەری خودا، فەرمووی: هەر بەندەیەکی خودا شایەتمان بهێنێت؛ بڵێت: هیچ خودایەک نییە جگە لە ئەڵڵا، موحەممەدیش پێغەمبەری خودایە؛ ئەوە خودا

---

[١٢] لە گێڕانەوەی: بوخاری: (٤٢٥، ١١٨٦، ٥٤٠١) و موسلیم: (٣٣).



چوونە دۆزەخی لێ حەرام دەکات"[13]، وە موسلیم لە عوبادەوە کە "هەر بەندەیەکی خودا شایەتمان بهێنێت؛ بڵێت: هیچ خودایەک نییە جگە لە ئەڵڵا، موحەممەدیش بەندە و پێغەمبەری خودایە؛ ئەوە خودا چوونە دۆزەخی لێ حەرام دەکات"، ، هەروەها فەرموودەگەلێک کە تێیدا هاتووە: هەرکەسێک تەنها شایەتمان بهێنێت؛ ئەوە دەچێتە بەهەشت، بەڵام ئەوەی تێدا نییە کە لە دۆزەخ حەرام دەکرێت، لەوانە: ئەم فەرموودەیەی ئەبوهورەیرە: کە لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) لە تەبووک بوون... تا: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی: شاهێدی دەدەم کە هیچ خوایەک نییە بێجگە لە ئەڵڵا و منیش پێغەمبەری خودام، هەر بەندەیەک بەم شایەتمانە بگاتە خودا و گومانی نەبێت؛ خودا بەهەشتی لێ قەدەغە ناکات"[14]، شێخ سولەیمان دەڵێت: "باشترین شتێک کە لە واتای ئەمەدا گوترابێت؛ ئەوەیە کە شێخی ئیسلام ئیبن تەیمییە و غەیری ئەویش گوتوویانە: ئەم فەرموودانە تەنها لەمەڕ کەسانێکن کە بیڵێن و لەسەری بمرن ـ هەروەک بە کۆتبەندیش هاتووە ـ وە بە پاکی و دڵنیایی لە دڵەوە بێت و هیچ گومانی لێی نەبێت و، بە ڕاستی و پەرۆشی بێت، چونکە حەقیقەتی یەکخواپەرستی ڕاکشانی گیانە بەرەو لای خودا بە تەواوی، جا هەر کەسێک لە دڵەوە بە پاکی (ئیخلاس) شاهێدی بدات کە هیچ خودایەک نییە جگە لە ئەڵڵا؛ ئەوە دەچێتە بەهەشت، چونکە ئیخلاس بریتییە لە ڕاکشانی دڵ بۆ لای خودای گەورە، بەوەی کە تۆبەی ڕاستەقینە بکات لە تاوانەکانی، جا ئەگەر لەسەر ئەو حاڵە بمرێت؛ ئەوە ئەو پاداشتە دەچێژێت، چونکە فەرموودەی پەیدەرپەی (متواتر) هاتوون، کە هەر کەسێک گوتبێتی (لا إله إلا الله) و بە ئەندازەی دەنکەجۆیەک و بەقەد خەردەلێک و ئەوەندی گەردیلەیەک کەڵک لە دڵیدا بێت؛ ئەوە لە ئاگر دەهێنرێتە دەرێ، هەر بەو چەشنەش هاتووە کە زۆرێک لەوانەی کە دەڵێن (لا إله إلا الله) دەچنە دۆزەخ و پاشان دەهێنرێنە دەرێ، هەروەها کە خودا حەرامی کردووە لە سەر ئاگر کە شوێنەواری سوژدەی مرۆڤەکان بخوات، چونکە ئەوانە نوێژیان

---

(١٣) ئەمیش هەر لە گێڕانەوەی: بوخاری: (١٢٨) و موسلیم: (٣٢).

(١٤) لە گێڕانەوەی: موسلیم: (٢٧).



کردووە و سوژدەیان بۆ خودا بردووە، وە هەر بە پەیدەرپەی هاتووە کە هەر کەسێک بڵێت: (لا إله إلا الله) و شایەتی بدات کە هیچ خودایەک نییە جگە لە ئەڵڵا و موحەممەدیش پێغەمبەری خودایە؛ ئەوە خودا ئاگری لێ حەرام کردووە، بەڵام بە کۆت و بەندی قورسەوە هاتووە، وە زۆربەی ئەوانەی کە دەیڵێن؛ نە ئیخلاس دەزانن نە یەقین، هەر کەسێکیش ئەوە نەزانێت ئەوە ترسی ئەوەی لێدەکرێت کە لە سەرەمەرگدا لێی بشێوێت و نەتوانێت بیڵێت، وە زۆرینە خەڵک کە دەیڵێن بە چاولێکەری و خووپێگرتن (عادەت) دەیڵێن، ئیمان تێکەڵ بە کانگەی دڵیان نەبووە، لەم جۆرە کەسانە پتر لە کاتی مردن و لە نێو گۆڕدا لێیان دەشێوێت، وەک لە فەرموودەدا هاتووە کە دەڵێت: «سمعت الناس يقولون شيئا فقلته»[(١٥)]، واتە: "گوێم لێبوو خەڵک دەیانگوت ئیدی منیش گوتم"، زۆربەی کار و کردەوەی ئەمانە تەنها چاولێکەرییە و لاسایی کردنەوە خەڵکییە، نزیکترین خەڵکیشن لەو وتەیەی خودای گەورەوە کە دەفەرموێت: {بَلْ قَالُوا إِنَّا وَجَدْنَا آبَاءَنَا عَلَى أُمَّةٍ وَإِنَّا عَلَى آثَارِهِمْ مُهْتَدُونَ}[سورة الزخرف: ٢٢]، واتە: "بەڵکوو گوتیان: ئێمە باب و باپرانمان لەسەر دینێک دیوە، ئێمەش هەر لەسەر ئەو جێ و ڕێیەی ئەوان دەڕۆین"، جا بەم شێوەیە؛ هیچ ناکۆکی و ناسازییەک نییە لە نێوان فەرموودەکاندا، چونکە ئەگەر بە ئیخلاس و یەقینێکی تەواوەوە بیڵێت؛ ئەوە لەم دۆخەدا هەرگیز پێداگر نابێت لەسەر تاوانێک، لەبەر ئەوەی تێروتەواویی ئیخلاس و یەقینەکەی وا دەخوازێت کە خودای لە هەموو شتێک خۆشتر بوێت، سەرەنجام هیچ ئارەزوویەکی بۆ حەرام و هیچ ڕقێکی بۆ فەرمانی خودا لە دڵدا نامێنێت، جا ئەمەیە کە حەرام دەکرێت لە ئاگر، ئەگەرچی پێش ئەوە گوناهیشی هەبووبێت، چونکە ئەو ئیمانە، ئەو تەوبەیە، ئەو ئیخلاسە و ئەو یەقینە هیچ تاوانێکی ناهێڵێتەوە و دەیسڕێتەوە، وەک چۆن شەو بە ڕۆژ دەسڕێتەوە". لێرەدا قسەکەی شێخ سولەیمان (ڕەحمەتی خودای لێبێت) کۆتایی هات[(١٦)].

---

(١٥) لە گێڕانەوەی: بوخاری: (٨٦) موسلیم: (٩٠٥).

(١٦) بڕوانە: (تيسير العزيز الحميد بشرح كتاب التوحيد: [٦٦-٦٧]).



وە شێخ موحەممەد بن عەبدولوەهاب (ڕەحمەتی خودای لێبێت) لە کتێبی (كشف الشبهات) دا دەفەرموێت: "ئەوانە گومانێکی دیکەیان هەیە، دەڵێن: پێغەمبەر (ﷺ) سەرزەنشتی ئوسامەی کرد کاتێک کابرایەکی کوشت پاش ئەوەی کە گوتی (لا إله إلا الله) و پێی فەرموو: "ئەوە کوشتت پاش ئەوەی کە گوتی (لا إله إلا الله)؟" [(١٧)]، هەروەها فەرموودەی دیکەش لەبارەی وازهێنان لە ئەوەی ئەو وتەیە بڵێت. جا مەبەستی ئەو نەفامانە ئەوەیە کە: هەر کەسێک ئەو وتەیە بڵێت کافر نابێت و ناکوژرێت ئەگەرچی هەر کارێکیش بکات، جا بەو نەفامانە دەگوترێت: خۆ دیارە کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) دژی جوولەکە دەجەنگی و کەنیزەکیشی لێدەگرتن؛ کەچی دەشیانگوت (لا إله إلا الله)، هاوەڵەکانی پێغەمبەری خوداش (ﷺ) دژی بەنی حەنیفە جەنگین لە کاتێکدا کە شایەتمانیان دەگوت بەوەی کە هیچ خودایەک نییە بێجگە لە ئەڵڵا و موحەممەدیش پێغەمبەری خودایە، نوێژیشیان دەکرد و خۆیشیان بە موسوڵمان دەزانی، هەروەها ئەوانەی کە عەلیی کوڕی ئەبوتالیب سوتاندنی، خۆ ئەم نەفامانە خۆشیان دەڵێن: ئەوەی نکوولّیی زیندووبوونەوە بکات؛ ئەوە کافر دەبێت، ئەگەرچی بشڵێت: (لا إله إلا الله)، وە هەر کەسێک نکوولّیی شتێک لە پایەکانی ئیسلام بکات ئەوە کافر دەبێت و دەشکوژرێت، ئەگەرچی بیشیڵێت، جا چۆن ئەگەر نکوولّی شتێک لە لقەکانی دین بکات سوودی نابێت بۆی؛ بەڵام سوودی دەبێت بۆی ئەگەر نکوولّیی یەکخواپەرستی بکات؛ کە بناغە و لوتکەی دینی پێغەمبەرانە؟!!! ئاخر ئەم دوژمنانەی خودا لە واتای فەرموودەکە تێنەگەیشتوون" [(١٨)].

هەروەها دەفەرموێت: "سەبارەت بە فەرموودەکەی ئوسامە، ئەوە کابرایەکی کوشت کە موسوڵمان بوونی خۆی ڕاگەیاند، لەبەر ئەوەی کە وایزانی لە ترسی گیان وماڵی موسوڵمان بوونی خۆی ڕادەگەیەنێت، کەسێکیش موسوڵمانەتیی

---

(١٧) لە گێڕانەوەی: بوخاری: (٤٢٦٩، ٦٨٧٢).

(١٨) بڕوانە: (مجموعة التوحيد: [١٢٠ - ١٢١]).

خۆی ئاشکرا بکات؛ دەبێت وازی لێبهێنرێت تا پێچەوانەی ئەوەی لێ دەردەکەوێت، خودای گەورە لەم بارەیەوە ئەمەی دابەزاند: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا ضَرَبْتُمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَتَبَيَّنُوا}[سورة النساء: ٩٤]، واتە: "ئەی ئەوانەی کە ئیمانتان هێناوە! ئەگەر چوون بۆ جیهاد لە پێناوی خودا؛ شتان ڕوون بکەنەوە"، واتە: قایمکاری بکەن لە کارەکانتاندا و لێی ورد ببنەوە، ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە واجبە دەستی لێهەڵبگیرێت و لێی ورد بیتەوە، جا ئەگەر شتێکی لێدەرکەوت کە پێچەوانەی موسوڵمانێتیی ئەو بوو؛ ئەوسا دەکوژرێت، لەبەر گوتەی (فتبينوا)، خۆ ئەگەر پاش لێوردبوونەوەش هەر نەکوژرابا؛ ئەو کاتە لێوردبوونەوەش بێ مانا دەبوو، هەروەها فەرموودەکەی دیکە و هاوشێوەکانیشی؛ هەمان واتایان هەیە کە باسمان کرد، کە هەر کەسێک موسوڵمانێتی و یەکخواپەرستیی ئاشکرا کرد؛ ئەوە دەبێت وازی لێبهێنرێت، مەگەر بە پێچەوانەوە شتێکی لێدەرکەوێت کە ناکۆک بێت لە گەڵ ڕواڵەتەکەدا.

بەڵگەش لەسەر ئەمە؛ ئەوەیە کە پێغەمبەرێک (ﷺ) کە فەرموویەتی: "ئەوە کوشتت پاش ئەوەی کە گوتی (لا إله إلا الله)؟"، وە فەرموویەتی: «أمرت أن أقاتل الناس حتى يقولوا لا إله إلا الله»[(١٩)]، واتە: "فەرمانم پێدراوە کە لە گەڵ خەڵکی بجەنگێم تاکوو دەڵێن: (لا إله إلا الله)؛ ئەو پێغەمبەرە (ﷺ) هەمان پێغەمبەرە کە لە بارەی (خەواریج) ەوە فەرموویەتی: «أينما لقيتموهم فاقتلوهم ، لئن أدركتهم لأقتلنهم قتل عاد»[(٢٠)]، واتە: "لە هەرکوێیەک پێیان گەیشتن؛ بیانکوژن، ئەگەر پێیان بگەم دەیانکوژم وەک کوشتاری قەومی (عاد)"، ئەمە لەگەڵ ئەوەی کە لە هەموو کەس زۆرتر (لا إله إلا الله) یان دەگوت، تەنانەت هاوەڵە بەڕێزەکان لە ئاست پەرستشی ئەواندا؛ خۆیانیان بەکەم دەزانی، زانستیشیان لە هاوەڵان وەرگرتووە، بەڵام نە (لا إله إلا الله) دادی دان؛ نە پەرستشی زۆر و زەبەند و نە بانگەشەی ئیسلامەتیش، ئەمەش لەبەر ئەو

---

(١٩) لەگێڕانەوەی: بوخاری: (٢٤، ٣٩٢).

(٢٠) لە گێڕانەوەی: بوخاری: (٣٦١١، ٥٠٥٧، ٦٩٣٠) و موسلیم: (١٠٦٤).



بەرهەڵستییەی کە بەرامبەر بە شەریعەت لێیانەوە سەریهەڵدا. ئەوەش کە باسمان کرد لە جەنگان دژی جوولەکە و جەنگی هاوەڵان دژ بە بەنی حەنیفە، ئەویش هەر بەم چەشنە.

حافیز ئیبن ڕەجەب لە نامیلکەیەکیدا بە ناوی (كلمة الإخلاص) دا؛ سەبارەت بەم فەرمایشتەی پێغەمبەر (ﷺ): «أمرت أن أقاتل الناس حتى يشهدوا أن لا إله إلا الله، وأن محمدا رسول الله»، واتە: "فەرمانم پێدراوە کە لە گەڵ خەڵکی بجەنگێم تاکوو شاهێدی دەدەن کە هیچ خودایەکی ڕاستەقینە نییە بێجگە لە ئەڵڵا، وە موحەممەد پێغەمبەری خودایە"؛ دەفەرموێت: "عومەر و کۆمەڵێک لە هاوەڵان وا تێگەیشتن، کە هەر کەسێک شایەتمان بهێنێت؛ ئەوە سزای دونیای لێ هەڵدەگیرێت، هەر بۆیە لەمەڕ جەنگی زەکاتنەدەرەکان ڕاوەستان، بەڵام ئەبوبەکری سددیق وا تێگەیشت کە تەنها بەم وتنە جەنگیان لە دژ ناوەستێت؛ بەڵکوو دەبێت مافەکانی جێبەجێ بکەن، لەبەر وتەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم): «فإذا فعلوا منعوا مني دماءهم وأموالهم إلا بحقها وحسابهم على الله»، واتە: "ئەگەر ئەوەیان کرد؛ ئەوە خوێن و ماڵیان لە من قەدەغە کردووە، مەگەر لە حەققی ـ شایەتمان و نوێژ و زەکات ـ دا، و حیسابیشیان لای خودایە"، ئەبوبەکریش فەرمووی: «الزكاة حق المال»[21]، واتە: "زەکات مافی سامانە"، هەر ئەم تێگەیشتنەی ئەبوبەکری سددیق؛ چەند هاوەڵێک لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ەوە گێڕاویانەتەوە، لەوانە ئیبن عومەر و ئەنەس و غەیری ئەوانیش، فەرموویەتی: «أمرت أن أقاتل الناس حتى يشهدوا أن لا إله إلا الله وأن محمدا رسول الله ويقيموا الصلاة ويؤتوا الزكاة»، واتە: فەرمانم پێدراوە بجەنگێم لە دژی خەڵکی، تا شایەتی دەدەن کە هیچ خودایەکی ڕاستەقینە نییە جگە لە ئەڵڵا، وە موحەممەد پێغەمبەری خودایە و نوێژ دەکەن و زەکاتیش دەدەن"، وە وتەی خودای گەورەش ئەوە دەگەینێت، کە دەفەرموێت: {فَإِنْ تَابُوا وَأَقَامُوا الصَّلَاةَ وَآتَوُا الزَّكَاةَ فَخَلُّوا سَبِيلَهُمْ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ}[سورة التوبة: ٥]، واتە: "جا ئەگەر تەوبەیان کرد و نوێژیان کرد و زەکاتیان دا؛ ئەوە وازیان لێبهێنن، بە ڕاستی خودا بەخشندە و

میهرداره"، هەروەها دەفەرموێت: {فَإِنْ تَابُوا وَأَقَامُوا الصَّلَاةَ وَآتَوُا الزَّكَاةَ فَإِخْوَانُكُمْ فِي الدِّينِ وَنُفَصِّلُ الْآيَاتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ}[سورة التوبة: ١١]، واتە: "ئەگەر تەوبەیان کرد و نوێژیان کرد و زەکاتیان دا؛ ئەوسا براتانن لە دیندا، ئێمە ئایەتەکانمان ڕوون دەکەینەوە بۆ خەڵکێک کە دەیانەوێت بزانن"، ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە بەبێ بەجێگەیاندنی فەرزەکان لەگەڵ یەکخواپەرستیدا؛ برایەتی لە دیندا بەدی نایەت، تۆبەش لە شیرک بەدی نایەت بە یەکخواپەرستی نەبێت، جا کاتێک ئەبوبەکر ئەمەی بۆ هاوەڵان سەلماند؛ ئەوانیش گەڕانەوە بۆ سەر قسەی ئەو و ئەوەی ئەویان بە ڕاست زانی. ئیدی زانیمان کە سزای دونیا هەڵناگیرێت لەسەر کەسێک کە تەنها هەر شایەتمان بهێنێت، بەڵکوو بە کەمتەرخەمی کردنی لە حەقێک لە حەقەکانی ئیسلام سزا دەدرێت، هەر بەم جۆرە سزای ڕۆژی دواییش دەمێنێت و هەڵناگیرێت".

هەر ئیمامی ئیبن ڕەجەب لە (كلمة الإخلاص) دا دەفەرموێت: "دەستەیەک لە زانایان گوتوویانە: مەبەست لەم فەرموودانە؛ ئەوەیە کە گوتنی (لا إله إلا الله) هۆکار و پێداویستێکە بۆ چوونە بەهەشت، بەڵام ئەم پێداویستە کاری خۆی ناکات ئەگەر مەرجەکانی تێدا کۆ نەبنەوە و ڕێگرەکانی لانەچن، بۆیە پێدەچێت ئەم پێداویستەی لە کیس بچێت بە هۆی لە دەست دانی مەرجێک لە مەرجەکانی یان هەبوونی ڕێگرێک، ئەمە بۆچوونی حەسەنی بەسری و وەهبی کوڕی مونەببیهە و ڕوونترین بۆچوونیشە" پاشان لە حەسەنی بەسرییەوە دەگێڕێتەوە کە بە (فەرەزدەق)ی شاعیری گوت - کاتێک خەریکی بەخاکسپاردنی ژنەکەی بوو - پێی گوت: چیت بۆ ئەم ڕۆژە ئامادە کردووە، گوتی: ئەمە حەفتا ساڵە شایەتمانی (لا إله إلا الله)م ئامادەکردووە، حەسەن گوتی: ئەوە باشترین توێشووە، بەڵام (لا إله إلا الله) مەرجی هەیە، هەربۆیە خۆت دوور بگرە لە بوختیان کردن بۆ ئافرەت پاکداوێن. جارێکیش بە حەسەنیان گوت: خەڵکانێک هەن دەڵێن: هەر کەسێک بڵێت: (لا إله إلا الله) دەچێتە بەهەشت، حەسەن گوتی: هەر کەسێک بڵێت (لا إله إلا الله) و دواییش ماف و داخوازییەکانی



جێبەجێ بکات؛ ئەوسا دەچێتە بەهەشت". کابرایەکیش پرسیاری لە وەهبی کوڕی مونەببیهـ کرد: مەگەر (لا إله إلا الله) کلیلی بەهەشت نییە؟ وەهب فەرمووی: بەڵێ بەڵام هەموو کلیلێک ددانەی هەیە، ئەگەر کلیلێکی ددانەدارت پێبێت؛ ئەوە بۆت دەکاتەوە، ئەگینا نەخێر..

پێم وایە ئەمەندە بەسە لە وتەی زانایان بۆ پەرچ دانەوەی ئەو گومانەی کە خەڵکێک پێوەی گیرۆدەیە، گوایە ئەوەی بڵێت (لا إله إلا الله) ئیدی کافر نابێت؛ ئەگەرچی جۆرەها شیرکی گەورەش ئەنجام بدات، وەک ئەوەی کە لەم ڕۆژگارەدا لای گڵکۆ و گۆڕی پیاوچاکان دەکرێت، کە بەتەواوی ناکۆک و دژە لە گەڵ وتەی (لا إله إلا الله)، و ڕێبازی دڵ بیمارانە، ئەوانەی کە لە دەقەکانی قورئان و سوننەت هەر ئەوەی وەردەگرن کە بە گومانی خۆیان بەڵگەیە بۆیان، ئەمە لە دەقە کورتەکان، بەڵام ئەو دەقە درێژانەی کە ڕوونیان دەکەنەوە پشتگوێیان دەخەن، وەک حاڵی ئەوانەی کە ئیمان دێنن بە هەندێک لە قورئان و ئیمان ناهێنن بە هەندێکی، خودای گەورە لەبارەی ئەم جۆرە خەڵکانەوە دەفەرموێت: {هُوَ الَّذِي أَنْزَلَ عَلَيْكَ الْكِتَابَ مِنْهُ آيَاتٌ مُحْكَمَاتٌ هُنَّ أُمُّ الْكِتَابِ وَأُخَرُ مُتَشَابِهَاتٌ فَأَمَّا الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ زَيْغٌ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَابَهَ مِنْهُ ابْتِغَاءَ الْفِتْنَةِ وَابْتِغَاءَ تَأْوِيلِهِ وَمَا يَعْلَمُ تَأْوِيلَهُ إِلَّا اللَّهُ وَالرَّاسِخُونَ فِي الْعِلْمِ يَقُولُونَ آمَنَّا بِهِ كُلٌّ مِنْ عِنْدِ رَبِّنَا وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّا أُولُو الْأَلْبَابِ * رَبَّنَا لَا تُزِغْ قُلُوبَنَا بَعْدَ إِذْ هَدَيْتَنَا وَهَبْ لَنَا مِنْ لَدُنْكَ رَحْمَةً إِنَّكَ أَنْتَ الْوَهَّابُ * رَبَّنَا إِنَّكَ جَامِعُ النَّاسِ لِيَوْمٍ لَا رَيْبَ فِيهِ إِنَّ اللَّهَ لَا يُخْلِفُ الْمِيعَادَ}[سورة آل عمران: ٧ – ٩]، واتە: "ئەو خودایەی کە قورئانی بۆ ناردوویتە خوارێ، ـ ئەو قورئانە ـ ئایەتگەلی پتەوی تێدایە ئەوانە ماکی قورئانن، تێیشیدایە لەیەک دەچن ـ واتای جۆراوجۆر هەڵدەگرن ـ، جا ئەوانەی کە دڵیان بیمارە؛ تەنها شوێنی وێکچووەکان دەکەون، بۆ چەواشەکاری و لێکدانەوەی بە گوێرەی ئارەزوویان، وە ـ ئەو ئایەتە وێکچووانە ـ خودا نەبێت کەس ڕاڤەیان نازانێت، زۆرزانەکانیش دەڵێن: ئیمانمان پێیەتی و هەمووی هەر لە پەروەردگارمانەوەیە، کەسیش بە وردی بیرناکاتەوە مەگەر هۆشمەندەکان * ئەی پەروەردگارمان! پاش ئەوەی کە ڕێنموونیت کردین؛ دڵمان دەغەزدار مەکە، وە لە میهری خۆتمان پێ ببەخشە،

بەڕاستی تۆ زۆربەخشندەیت * ئەی پەروەردگارمان! هەر تۆ مەردم کۆ دەکەیتەوە لە ڕۆژێکدا کە هیچ دوودڵیی تێدا نییە، خودا هەرگیز بەڵێن ناشکێنێت".

سا خودایە حەقمان پیشاندە وشوێنکەتنیمان پێببەخشە و پووچەڵیشمان پیشاندە و دوورمان بخەوە لێی.
وصلی الله وسلم علی نبینا محمد وآله وصحبه أجمعین . . والحمد لله رب العالمین .

**بە کۆمەکی خودای گەورە، ڕۆژی دووشەممە، مێژووی ٧ ی جومادیی دووەمی ساڵی ١٤٢٩ک لێبوومەوە لە پاچڤە و نووسینەوەی ئەم نامیلکە بەپێزە.**
**دەسا سوپاسی زۆر و زەبەندە بۆ خودای تاکی جێنیازی بەندە**
خدرنەژاد کوردستانی

بۆ پێوەندی کردن بە وەرگێڕەوە، دەتوانن ئەم ئیمەیڵەی خوارێ بەکاربهێنن
xdrnejad@gmail.com